بِسْمِ اللهِ الرحمنِ الرحيم

پێشەکی: ....بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان { إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ }
خودایە تەنها تۆ دەپەرستین تەنها بەرنامەو پرۆگرامەکەی تۆمان لا پەسەندە، هەر گوێرایەڵ و ملکەچی تۆ دەبین تەنها داوای کۆمەک لە تۆ دەکەین .

برایان و خوشکانی باوەردار ئەم نامیلکەی بەردەستت بریتیە لە ووتارێکی دەنگی مامۆستای خۆشەویست و حەق بێژ مامۆستا [کامران کەریم]ە الله بە شەهیدی قبووڵ کردبێ کە بریتیە لە شەرحی فەرموودەی {سید الاستغفار] هەربۆیە منیش بەباشم زانی بیکەم بە نامیلکە بۆ ئەوەی گەنجان و برایانمان سوودی لێوەرگرن ان شاء الله چونکە بەراستی لە مرۆدا بەلعامەکانی زەمانە گەلەک زۆر بوونە پێویستە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ لای قورئان و سوننەت لە کۆتاییدا ئامۆژگاریەکی زۆر بەسوودی مامۆستای خۆشەویست [ابن القیم] بە بیرە خۆم و ئێوەی بەڕێز دێنمەوە کە دەڵێ {لەو لایەبە کە خواو پێغەمبەرەکەی لێیە ئەگەر هەموو خەڵکی لە لاکەی تر بن}.

وأخر دعوانا أن الحمدالله رب العالمين

ڕێبوار هەولێری

خوای گەورە داوای لە ئێمە کردووە داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەین، بەڵام گەورەترین ووشە کە بیڵێین ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا[صلى الله عليه وسلم] فێری کردووین داوای لێبووردن لە خوا بکەین چیە؟

هەموو دوونیا هەستێ بەقەد ئەم کەلیمەیە خێرنیە ، کە ئەو فێری کردووین ئەو ناوی ناوە {سيد الاستغفار} کە دەبێت هەموومان لەبەری بکەین .

ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە، لە شەددادی کوری ئەوسەوە کە پێغەمبەر[صلى الله عليه وسلم] فەرموویەتی {اللَّهُمَّ أَنتَ رَبِّي لا إلهَ إلا أنْتَ، خَلَقْتَني وَ أنَا عَبْدُك، وَ أَنَا عليَ عَهدِكَ وَوَعدِكَ ما ستَطَعتْ، أَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما صَنَعْتْ، أبوُءُ لَكَ بِنعْمَتكَ عَليَّ، وأبوُءُ بِذَنْبي فَاغْفِرْ لي فَاغْفِرْ لي فَإِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنوُبَ إلاّ أَنْتْ} أخرجه البخاري ٧/١٥٠

هەرکەسێک بە ڕۆژ ئەم زیکرە بە دڵنیاییەوە بخوێنێ گەر لەم ڕۆژەدا بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە ، هەرکەسێک لە دوای عەسر بیخوێنێ بە یەقینەوە بیخوێنێ بەر لەوەی بەیانی بکاتەوە بمرێ ئەوا لە بەهەشت دایە، بەڵام دەبێ یەقینی هەبێ هەروەها تەنها ووشەی زارەکی نەبێ ئەبێ لە دڵەوە بێتە دەرەوە بە زمان بە عەمەل بەڵێ ئیسلام ئاوایە .

ئێستا دێینە سەر شەرحی فەرموودەکە لە لایەن [مامۆستا کامەران کەریم]ەوە کراوە داواکارین لە الله بە شەهید قبولی کردبێ .

اللَّهُمَّ أَنتَ رَبي :یەکەم شتێ تۆ ئیعتراف بە عبودیەت دەکەی ئیعتراف بەوە دەکەی تۆ بەندەی خودای ، ئیعتراف بەوە دەکەی خوایەک هەیە ناوی [الله]یە ئەو [خالقە] ئەو [الە] کەس مشارەکەی ئەو خوایەی نەکردووە لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی ، نە لەوەی عیبادەت بۆ کەسێکی تر بکەی جگە لە الله دەبێ ئەو ئیمانەت هەبێ [اللهم] ئەم کەلیمەیە لە زمانی عەرەبی واتا [یا الله] هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەری خوا فێری ئەوەمان دەکات بڵێین یا الله کەواتە کەتۆ دەڵێی [اللهم] واتا یا الله تۆ ناڵێی [یا رسول الله ، یا ئادەم ،یا نوح] یا[ ملائکە، یا جبریل،یا فلان] یەکەم جار فێری ئەوەت دەکات { اللَّهُمَّ أَنتَ رَبي} تۆ خودای منی، تۆ منت درووست

کردووه تۆ من بەڕێوە دەبەی،تۆ من دەژیێنی، ڕاتب من ناژیەنیٚ، حکومەت من ناژیەنیٚ ئەگەر بە قسەی نەکەم ڕاتبەکەی بڕیم بلێم ماڵ وێران بووم ڕزقی بڕیم نا تۆ من بەخێو دەکەی دونیا هەرهەمووی لەسەر یەک ڕاوەستیٚ بە قسەی ناکەم تەنیا بەقسەی تۆ دەکەم.

چونکە تۆ من بەخێو دەکەی چونکە ئەگەر تۆ لێم بگریتەوە ئەوا کەس ناتوانیٚ بمداتەوە، هەمووتان بیروباوەڕتان وانیە بەلاٚم بە عەمەل یان بە کردەوە واین کاکە ڕاتبەکەم دەبڕن قور دەکریٚ بەسەرما ئەگەر ئەونە بلێیٚ بەقسەی نەکەم دوایی ڕاتبەکەم دەبڕن ئەی تۆ نالێی { اللَّهُمَّ أَنتَ رَبي} کیٚ ڕەببی منە تۆ ئەی حکومەت تۆ ڕەببی منی تۆ من بەخێو دەکەی خۆ ئەوە نالێی دەلێی { اللَّهُمَّ أَنتَ رَبي} ئەوە یەقینتە بەم ووشانە { أَنتَ رَبي} لێرە بەمانای زۆرە ئاگاداربن کە لێرە دەلێیٚ { أنتَ رَبي} لێرە تەماشا بکە دەلێیٚ { لا إلهَ إلا أنْتَ} هیچ خوایەک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق جگە لە الله کەس قیمەتی ئەوەی نیە من بە قسەی بکەم جگە لەتۆ هەرکەسێک بیٚ تۆ وو شتێک بلێیٚ مخالفەی قسەی تۆبیٚ مـــــــن بەقسەی ناکەم { لا إلهَ إلا أنْتَ} بەتەنها تۆ،

{خَلَقتَني} دیسان دێیتەوە بۆسەر [تەوحیدی ربوبیەت] خوایە تۆمنت درووست کردووە

{ وَ أنَا عَبْدُك} ئیعتراف دەکەی دیسان بەبەندایەتی، من بەندەی تۆم بەندەی کەس نیم جگە لەتۆ کەس سەیدو گەورەم نیە لەتۆ زیاتر بەلاٚم ئایا لە واق یعدا وایە؟ هەمووتان بیری لیٚ بکەنەوە.

{ وَ أَنَا علَيَ عَهدِكَ وَوَعدِكَ ما ستَطَعتْ} ئینجا تۆ لێرە پەیمان دەدەی بە کیٚ بە الله بەیعەت دەدەی بە کیٚ بە الله بەیعەتی خوای ئەخەیتە گەردەنی خۆت [وَ أَنَا علَيَ عَهدِكَ] من لەسەر ئەو وەعدەم کەتۆ لەمنت داواکردووە دەزانن عەهدی خوای چیە؟ الله سبحان وتعالی دەفەرموویٚ {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ (Yaseen :60)

{ألم أعهد إليكم يا بنى آدم} ئەی نەوەکانی ئادەم! ئاخرمن پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن {أن لا تعبدوا الشيطان إنه لكم عدو مبين} کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بۆئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ؟ (تەفسیری ڕامان)

{وَأَنِ اعْبُدُونِي ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ} (Yaseen :61)

ئەی فەرمانم پێنەکردن کە تەنها من بپەرستن و پەیڕەویی لەمن بکەن، ئائەمەیە(واتە: پەرستنم بەتەنیا) ڕێ ڕاستەکە (تەفسیری ڕامان)

{ وَ أَنَا عليَ عَهدِكَ} من لەسەر ئەو پەیمانەی تۆم چی بلێی بەقسەت دەکەم خودایە، { وَوَعدِكَ} وەعدم لێرە چیە؟ واتە: ئەو بەهەشتەی کەتۆ داتناوە من پەیمان ئەدەم بەتۆ کە بەقسەی تۆ بکەم لەبەر ئەوەی کە تۆ وتت بەقسەم بکەن من بەهەشتان ئەدەمێ من داوای ئەو بەهەشتەت لێ دەکەم، ئەوەیە خوای تعالى دەفەرمووێ وەعدم داوەتە ئێوە ئەگەر ئێوە ئیمان وعەمەلی سالح بکەن تەنها بەندایەتی من بکەن بەهەشتان ئەدەمێ هەروەها خۆمتان پێ نیشان ئەدەم الله اكبر خوایە من لەسەر ئەو وەعدەم من داوای ئەو وەعدەت لێ دەکەم لە قیامەتیش ئەلێین خودایە ئەوەمان بدەرێ کە ئەو وەعدەت پێ داوین لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەت رسول الله [صلى الله عليه وسلم] .

ئینجا دەڵێ{ما ستَطَعتُ} بە گوێرەی توانای خۆم چونکە هەرکەسێک توانایەکی هەیە ، {أَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما صَنَعْتُ} من پەنا دەگرم بەتۆ کە هەرشتێکم کردبێ لە شەری هەرشتێ کردوومە پەنا ئەگرم بەتۆ ئەی خودایە داوای لێ بووردن لە خوا ئەکەی، ئینجا {أبوُءُ لَكَ بِنِعْمَتِك عَليَّ} من ئیعتراف دەکەم بەهەموو نیعمەتەکانت لە سەر خۆم، {وأبوُءُ بِذَنْبي} من ئیعتراف ئەکەم بەهەموو گوناهەکانم لووت بەرز نیم بلێم نەم کردووە ناوەالله پیاوێکی باشم ناوەالله خودایە گەر تۆ بەیەک گوناح بمگری هەتا هەتایە ئەم سووتێنی من داوای ئەوەت لێ دەکەم لێم خۆش بی بۆیە ئینسانی موسولمان خۆ بەکەم زانە زۆر دەبیستم دەلێ مامۆستا من وا باشم ئاوا کاکە بەخوا خراپەیەکم نیە تۆ وا دەلێی کەسمان هەیە

خراپەمان نەبێ خۆ مەلائیکەت نین ئیعتراف بکە لای خوا لای کەس باسی مەکە بیشارەوە چاکە ئەکەی بیشارەوە دێ بۆم باس ئەکات ئەوەم کرد ئەوەم کرد بۆ بۆمن باسی ئەکەی بۆ خوات کردووە [ئەلێ ڕاست بیبەخشێ چەپ پێی نەزانێ] بیشارەوە عیبادەتەکە مەکە بە ریاء هەلەشت کرد داوای لێ بووردن لە خوا بکە خۆت پاک مەکەرەوە لای خەلک یان بە خەلکی بلێی من پاکم خوای گەورە ئەفەرمووێ {خۆت بە پاک دامەنێ خودا ئەزانێ کێ پاکە} مانای ئەوە نیە تۆ پاک مەبە ئەلێ هەول بە پاک بە بەلام مەلێ پاکم خودا ئەزانێ کێ پاکە {**فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ**} (An-Najm :32)**واتە** [جا کەوابوو پاکانە بۆ خۆتان مەکەن و، خۆتان هەڵ مەکێشن ئەو زاناترە بەو کەسەی خۆی دەپارێزێ و سنوورەکانی نابەزێنێ. (تەفسیری ڕامان)

{**فَاغْفِرْ لِي**} خودایە لە گوناهەکانم خۆشبە دام پۆشە ئابروم مەبە سزاشم مەدە { **فَإِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذّنوُبَ إلاّ أَنْتْ** } لە تۆ زیاتر کەس ناتوانێ نە پێغەمبەران نە پیاوچاکان نەخێر هیچ کەسێ ناتوانێ ئەگەر هەموو دوونیا هەستێ ناتوانێ لە گوناهێکم خۆش بێ جگە لە زاتی پیرۆزی تۆ.

ئینجا ئەوە هەرکەسێ بەیانیان بیخوێنێ بە یەقینەوە بەم شێوازە هەتا ئێوارە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە بەمەرجێک **نواقظي** ئیسلامی نەبێ.

"وصل الله وسلم علي نبينا محمد وآله وصحبه"